پێ ی ووت: من هەرگیز پێ نانێم بەسەری یەکێکدا کە کڕنووش بۆ پەروەردگار دەبات!.

کاتێك ژنێکی بەپایە و ناسراویش لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) دزی کرد، ئەوەبوو کەس وکارەکەی بۆ تکاکردن (ئوسامەی کوڕی زەید)ی خۆشەویستی پێغەمبەریان نارد، پێغەمبەریش (ﷺ) کە ئوسامە داوای لێکرد دەستی ژنەکە نەبڕێت، تووڕەبوو لێی و پێ ی ووت: ﴿أتشفع في حد من حدود الله، ثم قام فاختطب ، ثم قال: «إنما أهلك الذين قبلكم أنهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه ، وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد ، وايم الله ، لو أن فاطمة ابنة محمد سرقت لقطعت يدها»﴾ (رواه البخاري ومسلم)، واتە: تۆ تکا لە یاسایەکی پەروەردگاردا دەکەیت؟! ئەوبوو چووە سەر مینبەر و بۆ خەڵکی ووتاریدا و پێ ی ووتن: ئەوەی کە بووە مایەی فەوتانی میللەتانی پێش ئێوە ئەوەبووە کە کاتێك پایەبەرزێك دزی (یان تاوانێکی تری دەکرد) وازیان لێدەهێنا و سزایان نەدەدا و کاتێکیش کە لاوازێك دزی دەکرد حەدیان لەسەر جێبەجێ دەکرد و سزایان دەدا، سوێند بەخودا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەدیش دزی بکات من دەستی دەبڕم.

کاتێکیش سەردەمی خەلیفە (ئەبوبەکر) هات نموونەی سەرۆکی خۆ بەکەمزان و مرۆڤدۆست بوو، کە یەکێك لە عادەتەکانی ئەوەبووە لە کاتی فەرمانڕەوایییەکەیدا هەموو رۆژێك دەچووە ماڵی چەند کچێك لە گەڕەکەکەیدا کە باوکیان لە جەنگدا لەدەستدابوو و بە دەستی خۆی مەڕەکانی بۆ دەدۆشین و خزمەتی دەکردن، (عومەر)یش نموونەی خەلیفەی خاوەن غیرەت و بە بەزەیی بوو لەگەڵ هەژاراندا کە هەموو کەس لە بەرامبەریدا یەکسان بوون، زۆر جار لەخۆی دەبڕی و دەیدا بە لێقەوماوان، عادەتیشی وابووە کە بەسەر خەڵکیدا دەگەڕا لە ماڵەکانیاندا و چیرۆکی بەناوبانگی هەیە لەم بوارەدا کە بەدەست و شانی خۆی خزمەتی هەژارانی دەکرد و پێویستییەکانی بۆ دەستەبەر دەکردن، رۆژێك پیرەمێردێکی بینی کە لە بازاڕدا سواڵی دەکرد، لێ ی پرسی: تۆ چیت ئەی شێخ، ئەویش وەڵامی دایەوە: من جولەکەیەکم کە داوای سەرانەم لێدەکەن و ناچارم کە سواڵی بۆ بکەم، ئەوەبوو بەزەیی پێدا هاتەوە و دەستی گرت و بردی بۆ

لێپرسراوی خەزینەی (بیت المال) و پێی ووت: مانگانە بۆ ئەم و هاوشێوەی ئەمیش مووچەیەك ببڕەوە، کە بەشی ژیانیان بکات و لەسەر هەژارانی ئاینەکانی تر لە ژێردەستەکانمان سەرانە لابەن و لێیان مەسێنن.

عومەر تەنها کەسێك نەبوو کە شارستانییەتمان دروستی کردبێت و نموونەی مرۆڤایەتییەکی بە بەزەیی و کامڵ بێت، بەڵکو لە (ئەبوبەکر و عوسمان و عەلی و عومەری کوڕی عبدالعزیز و صلاح الدین) و غەیری ئەمانیش لە زانایان و گەورەپیاوان و سەرکردەکان و خواپەرستەکان و فەیلەسوفەکانی شارستانییەتماندا نموونەی زۆر بەرز هەن، کە لە هەموو یەکێکیاندا نموونەی بەرز و نەمری رۆحی مرۆڤایەتیی و بەزەیی دەبینین لە شارستانییەتماندا.

## یەکسانیی رەگەزیی:

ئەم لایەنە لایەنێکی درەوشاوەی شارستانێتی نەمری ئیسلامە، چونکە پەروەردگار یەکسانیی مرۆڤەکانی راگەیاندووە بەبێ سەیرکردنی رەنگی پێستیان، پێغەمبەریش (ﷺ) لە حەجیماڵئاواییدا وەستا و ووتارە نەمرەی فەرموو کە تێیدا هاتووە: ئەی خەڵکینە، ئادەمیزادەکان هەموویان نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە گڵەوە دروست بووە، رێزی عەرەبێك نییە بەسەر غەیری عەرەبدا یان سپی پێست بەسەر رەش پێستدا تەنها بە چاکەکاری و پارێزکاری نەبێت.

ئەم بنەمایەش تەنها دروشمێك نەبوو کە لە هەندێك بۆنەدا بووترێن وەك لەمرۆدا دەیبینین، بەڵکو یەکسانییەکی جێبەجێکراو بوو وەك هەموو کارێکی ئاسایی تر، لە مزگەوتەکاندا جێبەجێکراو بوو کاتێك کە سپی پێستەکان و رەش پێستەکان شانبەشانی یەك دەوەستان بۆ پەرستنی پەروەردگار، و لە حەجدا هەموو رەگەزە مرۆییەکان لەسپی و رەش و رەنگەکانی تر بەیەك پۆشاکەوە دەوەستن لەیەك شوێندا، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە (بیلال)ی کۆنە بەندەی رەش پێست کە بچێتەسەر سەربانی کەعبە و لەوێوە بانگ بدات لە رۆژی رزگارکردنی مەککەدا، کە بریتییە لە ماڵە حەرام کراوە پیرۆزەکەی لای موسوڵمانان، ئیتر چۆن تەصەور دەکرێت بەندەیەکی رەش پێست پێی پێدا بنێت و پێیدا سەرکەوێت؟!

نموونەی ئەمە یان هاوشێوەکەی لە شارستانێتی ئەمڕۆدا وێنەی نی‌یە تەنانەت لە ئەمریکاشدا، بەڵام شارستانێتی ئێمە پێش ١٤ سەدە ئەنجامیداوە، سەرکەوتنی بیلال ئاشکرا کردنی ڕێزی مرۆڤەکان بوو کە هەموو مرۆڤێك شایەنی ئەم ڕێزداریی‌یەیە بە زانست و باوەڕ و ئیمانەکەی نەك بەهۆی پیستە سپی‌یەکەیەوە، کاتێکیش موسوڵمانان فەتحی (میسر)یان کرد و لەبەردەم قەڵای (بابلیون)دا وەستان (المقوقس)ی فەرمانڕەوای (قیبتی‌یەکان) وویستی گفتوگۆیان لەگەڵ بکات و داوای نوێنەرێکیانی کرد، (عمرو بن العاص)ی سەرکردە وەفدێکی ١٠ کەسی بۆ نارد کە (عبادة بن الصامت)یان تێدابوو کە پیاوێکی تەواو ڕەش پێست و بالآبەرز بوو و (عمرو بن العاص) فەرمانی پێکرد کە ووتەبێژی ڕەسمی بێت، ئەوەبوو کاتێك چوونە لای (المقوقس) زۆر لە (عوبادە) ترسا لەبەر ڕەش پێستی‌یەکەی و پێ‌ی ووتن: ئەم ڕەشەم لێدووربخەنەوە و با یەکێکی تر قسەم بۆ بکات، وەفدی موسوڵمانان هەموویان ووتیان کە (عوبادە)ی ڕەشپێست گەورەمانە و لە هەموومان بەڕا ترە و هەموومان دەگەڕێینەوە بۆ قسەی ئەو و سەرکردەکەشمان ئەمی کردووە بە ئەمیرمان و داوای لێکردووین کە لە قسەی دەرنەچین، (المقوقس)یش ووتی: چۆن ڕازی بوون ئەم ڕەشە ببێت بە ئەمیرتان کە دەبوایە لەخوار ئێوەوە بووایە؟! هەموو ووتیان نەخێر لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەشە بەڵام لە هەموومان لەپێشتر و شارەزاتر و عاقڵتر و بەڕاترە و لای ئێمە ڕەشپێستی مایەی عەیب نی‌یە، ئەوەبوو (المقوقس) بەناچاری ڕووی کردە (عوبادە) و پێ‌ی ووت کە: بە نەرمی قسەم لەگەڵ بکە چونکە من لە ڕەشی‌یەکەی تۆ زۆر دەترسم، (عوبادە)ش کە ئەم ترسەی بینی بە فورسەتی زانی کە زیاتر بیترسێنێ و بە (المقوقس)ی ووت: دە بزانە لەناو سوپاکەی ئێمەدا ١٠٠٠ ڕەشپێستی تر هەیە کە زۆر لەمن ڕەشترن!.

(عبدالملك ی کوڕی مەروان)ی خەلیفەی ئومەوی لە هەموو وەرزێکی حەجدا فەرمانی دەکرد کە بە خەڵکەکە ڕابگەیەنرێت کە کەس بۆی نی‌یە فەتوا بدات بێجگە لە (عطاء بن أبي رباح) نەبێت، کە زانای شاری مەککە و ئیمام و فەقیهیان بووە، خوێنەری بەڕێز: دەزانیت ئەم زانایە چۆن کەسێك بووە؟ مێژوونووسان

دەڵێن پیاوێکی ڕەشپێستی قژلوولی لووتخواری شەل بووە و چاوێکیشی کوێربووە، هەر کەسێك شکڵی بیبینییایە ئومێدی هیچ شتێکی پێ‌ی نەدەبوو، کاتێك کە دادەنیشت لە کۆڕە زانستی‌یەکانی‌دا و هەزاران قوتابی چواردەوریان دەدا وەك قەلەڕەشێك دەردەکەوت کە لە کێڵگەیەکی لۆکەدا بێت! ئەم ڕەشپێستە کوێرە شەلە شارستانێتی ئێمە کردی بە مامۆستایەك کە خەڵکی بۆ فەتوای ئایینەکەیان دەچوون بۆ لای ئەو و قوتابخانەیەك بوو کە لەسەر دەستی هەزاران کەسی سپی پێست پێگەیشتن و لەلایان ڕێزدار و خۆشەویست و بەهەیبەت بووە.

کەسیش نی‌یە ناوی (كافور الإخشيدي) نەبیستبێت کە بەندەیەکی ڕەشپێست بووە و لە سەدەی چوارەمی کۆچی‌دا فەرمانڕەوای (میسر) بووە و هەرئەو بووە کە شاعیر (المتنبي) لە وەسفکردن و زەمکردنەکانی لە شیعرەکانی‌دا نەمری کردووە، کەواتە شارستانێتی ئێمە جیاوازی ڕەگەزی نێوان ڕەش و سپی نەزانیوە و کۆمەڵگەی تایبەت بە ڕەشپێستەکانی نەبووە کە سپی پێستەکان لێ‌ی نەژین، و سپی‌یەکان بیانچەوسێننەوە، بەڵکو شارستانێتی ئێمە بەچاوی ڕێزەوە ڕوانیویێتی‌یە هەموو مرۆڤەکان و بەچاوێکی عەدالەت و حەق سەیری هەموویانی کردووە، و ڕەش و سپی تەنها لە کردەوەکانی مرۆڤەکاندا دیاری کردووە نەك لە ڕەگەزیاندا.

ئەم قسەیەی ئێمە تا ماوەی ٥٠ ساڵیش پێش ئێستا زۆر غەریب بووە لە ڕۆژئاوادا، خۆ ئەم یەکسانی‌یە شتێکە پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە نی‌یە بۆی، و نیشانەی شارستانی‌یەتە پێشکەوتووەکانە کە بە تایبەتی شارستانێتی ئێمە بەتەواوی جێبەجێ‌ی کردووە، و شارستانێتی یەکسانی برایەتی نێوان خەڵکی بووە، بەڵام ئێمە لەدوای دروست بوونی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕاگەیاندنی جاڕدانی گەردوونی مافەکانی مرۆڤەوە دەبینین لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا پێویستمان بەم قسانە هەیە، ئەویش دوای ئەوەی ئەو چیرۆکە دڵتەزێنانەمان بیست و بینیمان دەربارەی جیاوازی ڕەگەزپەرستی‌یانە کە لە خوارووی ئەفریقا و ئەمریکاشدا ئەنجام دەدران، هەروەها تاوانە ئیستیعماری‌یە ئابڕووبەرەکانی دژ بە (کینیا)، و بارودۆخی ڕەشپێستەکان و زنوجەکانیش لە ئەمریکادا لە کەس

شاراوه نی‌یه، ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئەو کەسانەی تاوانە ڕەگەزپەرستی‌یەکانیان لە خوارووی ئەفریقا و کینیا و ئەمریکادا ئەنجامدا کەسانێکی ڕۆژهەڵات نەبوون تاوەکو یەکسەر بڵێن ئەمانە دواکەوتوو و هەمەجین! بەڵکو چەند دەوڵەتێکی بەناو پێشکەوتوو بوون، ئەوەتا ئەمریکا گەورەترین هێزێکە لە جیهاندا کە کۆنترۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکانی کردووە! (ئینگلتەرا)ش گەورەترین دەوڵەتی ئەوروپایە کە شانازی بە دیموکراتی‌یەکەیەوە دەکات! خوارووی ئەفریقاش بە چینێك لە کاربەدەستە ئەوروپی‌یەکان کە ئەو وڵاتەیان داگیرکرد لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا ناسراوە! وڵاتانی ئەمریکای خوارووش پلەیەکی بەرز و ڕای وەرگیراویان هەیە لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا! ئەم وڵاتانە بوون کە لە سەدەی بیستەمدا ناشرینترین و تۆقێنەرترین و قێزەونترین تاوانە ڕەگەزپەرستی‌یەکانیان ئەنجامدا، لەرووی چەوساندنەوەی مرۆڤەکان نەك لەبەر بێهێزی یان نەزانی‌یان بەڵکو بەهۆی جیاوازی ڕەنگی پێستیانەوە!!.

ئابووریناسی ئەمریکی (ڤیکتۆر بیرلو) دەڵێت: (ژەهرەکانی ڕەگەزپەرستی بەدرێژایی وڵات بڵاوبۆتەوە و چۆتە ناوکرۆکی ژیانی ئەمریکی‌یەکانەوە، هەربۆیە جەماوەر ڕاهاتووە لەگەڵ بەکارهێنانی زاراوە نزمەکان و گاڵتەجاڕی‌یەکان بۆ ئاماژەدان بە گەلی زنجی ڕەش و کەمە نەتەوایەتی‌یەکانی تریش)، هەروەها (جاك لیت) و (لی مۆرتیمەر) دەڵێن: (ئەمریکا لەناو وڵاتانی دونیادا بەوە ناوبانگی دەرکردووە کە دروشمەکەی پەیکەری ئازادی‌یە، کە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەرکی سەرشانمانە پێشوازی لە هەموو کۆچکەرێك بکەین کە پەنای بۆ وڵاتی ئێمە بردووە، کە یان لە چەوساندنەوە یان لە زوڵم وستەم ڕادەکەن، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە دوای ئەوەی ئەم پەیکەرە لەسەر بناغەکەی دانرا ئیتر مانای سەربەستی و ئازادی بەتەواوەتی لە وڵاتی ئێمەدا نەما).

بڕوانە ئەم نموونەیەش: لە ساڵی (١٩٤٦)دا لە شاری (کۆلۆمبیا) لە ئەمریکا ڕەشپێستێك و دایکی چوون بۆلای دوکانێکی ڕادیۆ چاککەرەوە بۆ چاکردنی ڕادیۆکەیان و کاتێك کرێی تەواویاندا بینی‌یان کە ڕادیۆکە چاك نەکراوە و وەك

خۆیەتی، دایکی ووتی: ئێمە (١٣) دۆلارمان داوە و رادیۆکە هێشتا لاڵە، ئەوەبوو خاوەنی دووکانەکە فەرمانی کرد کە دەرکرێن و یەکێك لە کارمەندەکانی شەقێکی دا لەدایکەکە و ئەویش کەوت بەسەر دەمدا، رەشپێستەکە بۆ دایکی تووڕە بوو و لە دەستدرێژکەرەکەیدا و دای بە زەویدا، ئەوەبوو دراوسێ دووکانەکەیان هات و هاواری کرد لە جەماوەر: ئەو دایك خراپە بکوژن! ئەوەبوو خەڵکە سپی‌یەکان کۆبوونەوە و هاواریان کرد با تۆڵە لە رەشپێستەکان بکەینەوە (کە مەبەستیان لە تۆڵە سەندنەوە لە رەشپێستەکان ئەوەیە کە سەریان لێبکرێتەوە بەبێ دادگایی کردن)، لە کۆتاییدا زۆر بە زەحمەت لەدەست خەڵکەکە سێندران و بران بۆ زیندان، بەلاّم جەماوەری سپی پێست بەمە رازی نەبوون و چوون بۆ گەڕەکی رەشپێستەکان بۆ تۆڵە سەندنەوە لە رەشپێستەکە و دایکی و پۆلیسیش ئابلۆقەی گەڕەکەکەیدا، ئیتر رەشپێستەکان بەبێ جیاوازی راوەدوونان کران و لە خانووەکانیان دەکران و سوتێنران و دووکانەکانیان تێك و پێك شکێنران و زۆریان بەر دەستڕێژی گوللە کەوتن و هەندێکیان کوژراو و بریندار بوون.

ئەمە هەمووی لەسەر ئەوەبوو کە ئافرەتێکی رەشپێست سکالاّی چاکنەکردنی رادیۆکەی کرد لای دوکانێکی سپی پێست کە کرێی چاککردنەکەشی بە تەواوەتی دابوو، ئەمە نموونەیەك بوو لە شارستانێتی ئەوان، بەلاّم بابڕوانینە نموونەیەك لە شارستانێتی ئێمە: لە ساڵی (١٠٠ك)دا واتە پێش ١٣ سەدە ئافرەتێکی کەنیزەی رەشپێست بەناوی (فرتونة) نامەیەکی سکالاّی نووسی بۆ خەلیفەی موسوڵمانان (عومەری کوڕی عبدالعزیز) کە ماڵێکی هەیە دیوارەکەی نزمە و بەهۆی ئەمەوە مریشکەکانی دەدزرێن، ئەوەبوو یەکسەر (عومەر) نامەی نارد بۆ کاربەدەستی میسر و داوای لێکرد کە ماڵی ئەو ئافرەتە چاك بکات، و پێی ووت: ئافرەتێك بەناوی (فرتونة) بۆی نووسیوم کە دیواری ماڵەکەی نزمە و مریشکەکانی دەدزرێن، هەرکاتێك ئەم نامەیەی منت بەدەست گەیشت خۆت دەبێت بچی بۆلای و کارەکەی بۆ جێبەجێ بکە! ئەوەبوو کاربەدەستی میسریش خۆی چوو ماڵەکەی دۆزی‌یەوە و بینی ئافرەتێکی رەشپێستی هەژارە و ئەوەی کە خەلیفەی موسوڵمانان پێی ووتبوو پێی راگەیاند و ماڵەکەی بۆ چاککرد، ئەمە

ئەوە بووە کە ئێمە پێش ١٣ سەدە ئەنجاممانداوە و نموونەیەکی شارستانی یەتمانە[1].

## چاوپۆشی و سنگفراوانی ئاینی:

ئەمە لایەنێکی ناوازەی ئێمەیە لە مێژووی ئاینەکان و بیروباوەڕەکاندا، کاتێك ئیسلام شارستانێتی خۆی دامەزراند قەڵس نەبوو بە شوێنکەوتووانی ئاینەکانی تر، موسوڵمانان باوەڕیان وابووە کە هەموو ئاینە ئاسمانییەکان یەك سەرچاوەیان هەیە: ﴿شرع لكم من الدين ما وصى به نوحا والذي أوحينا إليك وما وصينا به إبراهيم وموسى وعيسى أنْ أقيموا الدين ولا تتفرقوا فيه كبر على المشركين ما تـدعوهم إليه﴾ (الشورى:١٣) واتە: خودا ئەو ڕێبازی ئاین و بەرنامەی ژیانەی بۆ داناون کە پێشتر فەرمانی کردبوو بە (نوح)، و هەر بەو شێوەیەش قورئانی بۆ تۆ ئەی محمد (ﷺ) وەحی و نیگا کردووە کە بە ئیبراهیم و موسا و عیساشی ڕاگەیاندووە، کە ڕێبازی ئاین و یەکخواناسی بەرنەدەن و لەسەری پایەداربن و جیاواز مەبن تێیدا، ئەم بانگەوازە ڕاست و دروستە زۆر بەلای بتپەرستان و خوانەناسانەوە گران و زەحمەتە.

پێغەمبەرانیش هەموویان برابوون و پێویستە باوەڕ بەهەموویان بهێنین، هەروەها نابێت زۆر بکرێت لە کەس لە بیروباوەڕ وەرگرتندا ﴿لا إكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي﴾ (البقرة:٢٥٦)، واتە: بەهیچ شێوەیەك زۆرکردن نییە لە

---

(١) لە تاوانە ڕەگەزییە گەورەکانی سەردەمی نوێش بریتییە لە لەناوبردنی دانیشتوانی ڕەسەنی هەردوو کیشوەری ئەمریکای باکوور و باشوور (هیندییە سوورەکان)، کە بەپێی (ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی) لە ماوەی دوو سەدە و نیودا زوربەی هەرە زۆریان قەتڵ وعام کران کە ژمارەیان زیاد لە ١٠٠ ملیۆن بووە و تەنها ١٠ ملیۆنیان مانەوە! مرۆڤی سپی پێستی ڕۆژئاوایی دڵڕەق و بێبەزەیی ئەم تاوانەی ئەنجامدا، هەروەها تاوانێکی لەم گەورەتریش بریتی بوو لە ڕفاندنی زیاد لە ١٠٠ ملیۆن لە دانیشتوانی ڕەشپێستی ئەفریقا هەر لەم ماوەیەدا و بردنیان بۆ هەردوو ئەمریکاکە بۆ ئەوەی وەك بەندە لە خزمەتیاندا کاربکەن! کە هەر بەپێی (ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی) زیاد لە ٧٠ ملیۆنیان تیاچوون بەهۆی ئەشکەنجەدان و کاری لەتوانا بەدەر و لە شۆڕشەکانیاندا، هەروەها لەکاتی هەوڵەکانی ڕاکردنیاندا و بەهۆی ئەو نەخۆشییە درمانەش کە لەناویاندا بڵاوبووەوە، و زۆری تریان لەکاتی گواستنەوەیاندا گیانیان لەدەست دەدا!!.

وەرگرتنی بیروباوەڕی ئاینی ئیسلامدا (واتە دینداریی بەزۆر نابێت بکرێت و دین بەزۆر نادرێت بەسەر کەسدا)، چونکە بەڕاستی ڕێبازی چاك و دروست روون و ئاشکرابووە و جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی، لە ئیسلامدا شوێنەکانی پەرستن و پەرستگای ئاینەکانیش دەبێت ڕێزیان لێبگیرێت و پارێزگاری بکرێن لە دەستدرێژی، خەڵکی نابێت لەسەر جیاوازی ئاینی یەکتری بکوژن بەڵکو پێویستە هاوکاری یەکتری بکەن بۆ لەناوبردنی شەڕ و خراپە، جیاوازی ئاینی لەنێوان خەڵکیدا نابێت ڕێگربێت لە پەیوەندی دۆستانە و سەردانی یەکتری و دەبێت گفتوگۆ و موناقەشەی نێوانیان لە سنووری ئەدەب و ڕێز دەرنەچێت، هەرکاتێکیش دەستدرێژی کرایە سەر عەقیدە و بیروباوەڕ دەبێت وەڵامی ئەو دەستدرێژی و فیتنەیە بدرێتەوە و بەرگری بکرێت، دوای سەرکەوتنیش نابێت تۆڵە بسەندرێتەوە لە دەستدرێژیکەران بەوەی زۆریان لێبکرێت واز لە ئاینەکەیان بهێنن، و تەنها پێویستە لەسەریان دان بە دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامیدا بنێن و خیانەتی لێنەکەن، لەسەر ئەم بنەمایانە شارستانێتی ئێمە دامەزراوە.

**واقیعی کرداری پشتیوانی بنەماکانی سنگفراوانی ئاینیمان دەکات:**

دوای کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەدینە ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەی تێدابوو کە یەکسەر پەیماننامەیەکی لەگەڵ بەستن و ڕێزی لە بیروباوەڕیان گرت، موسوڵمانان هاوسێی گاوریشیان هەبووە کە چاك بوون لەگەڵیان و پێغەمبەر (ﷺ) میوانداری دەکردن، کاتێکیش وەفدی گاورەکانی (حەبەشە) و دواتر (نەجران) هاتن پێغەمبەر (ﷺ) ڕێیدان کە لە مزگەتەکەیدا بمێننەوە و لایەکی بۆ تەرخانکردن بۆ نوێژەکانیان و کاتێکیش گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن بەباشی گوێی لێدەگرتن و بەجوانی و هێمنی وەڵامی دەدانەوە، جێنشینەکانیش لەسەر شوێنپێی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشتن لە لێبوردەیی و سنگفراوانی ئاییینیدا، کاتێك کە (عومەری کوڕی خەتتاب) چووە شاری (قودس) وەڵامی دانیشتوانەکەی دایەوە بۆ هەموو داواکارییەکانیان، و کاتێك لە کڵێسای گەورەی شارەکەدا بوو و کاتی نوێژی عەسر هات لە کڵێساکە نوێژی نەکرد ئەویش لەبەر ئەوەی دوایی موسوڵمانان بەم بیانووەوە کڵێساکە نەکەن بە مزگەوت، بەم شێوەیە بەدرێژایی

مێژووی ئیسلامی کڵێساکان لە پەنا مزگەوتەکاندا بوون و پیاوانی ئاینی گاور و جوولەکە دەسەلاتی تەواویان دەدرایە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری شوێنکەوتووەکانیان.

هیچ یەکێك لە ئێمە هەڵوێستی سوڵتان (محمد الفاتح)ی عوسمانی بیرنا چێتەوە کاتێك کە شاری (قوستەنتینیە)ی پایتەختی رۆمەکانی رزگارکرد کە مەڵبەندی گاورەکانی کڵێسای ئۆرسۆدۆکسی رۆژهەلات بوو، لەو رۆژەدا رایگەیاند کە دانیشتوانە گاورەکانی هەموویان ئەمیننەوە و ئەمینن لە سەر و ماڵ و سامان و بیروباوەڕ و خاچەکانیشیاندا و نەیکردن بە سەربازیش، سەرانی خۆیانی بۆ دیاری کردن تا ناکۆکییەکانیان چارەسەر بکەن، کە هاوشێوەی ئەمەیان لە کاربەدەستەکانی خۆیشیان نەدیبوو، کە مەزهەبێکیانی پشتگیری دەکرد بەسەر مەزهەبێکی تردا.

لە نموونەی ئەم سنگفراوانییە ئاینییە ئەوەبوو کە کارەکان دەدران بەکەسانی لێهاتوو بەبێ گوێدانە ئاین و مەزهەبەکەی، هەربۆیە دەبینین کە پزیشکە گاورەکان لە سەردەمی ئومەوی و عەبباسییەکاندا زۆر چاودێری دەکران لەلایەن خەلیفەکانەوە و زۆرجار سەرپەرشتی قوتابخانە پزیشکییەکانیان دەکرد لە بەغدا و دیمەشقدا، (إبن أثال)ی گاور پزیشکی تایبەتی (موعاویە) بووە، (مروان)یش دوو گاور بەناوی (أتناسیوس و ئیسحاق)ی دیاری کرد لە کارە حکومییەکان لە میسردا، کە تەنانەت (أتناسیوس) گەیشتە پلەی سەرۆکی دیوانەکانی دەوڵەت.

یەکێك لە هەرە بەناوبانگترین پزیشکان لەلای خەلیفەکان ناوی (جرجیس بن بختیشوع)ی گاور بووە کە نزیك بووە لە خەلیفە (المنصور)، هەروەها (سلمویە بن بنان)ی گاور پزیشکی خەلیفە (المعتصم) بووە، (بختیشوع بن جرائیل)یش پزیشکی (المتوکل) بووە، (إبراهیم بن هلال الصابيء) کە لە دینی (صابیئە) بووە گەیشتە بەرزترین پلە وپایە لە دەوڵەتدا، کۆڕە زانستییەکانی خەلیفەکانیش زانایانی لەخۆدەگرت لە هەموو ئاین و مەزهەب و بیروباوەڕێك، بە تایبەتی کۆڕی خەلیفە (المأمون).

لە دیاردەکانی ئەم سنگفراوانی‌یە ئایینی‌یە بەشداری کردن بووە لە جەژنە ئاینی‌یەکاندا، لە سەردەمی ئومەوی‌یەکانەوە گاورەکان چەژنە گشتی‌یەکانی خۆیان هەبووە کە لە شەقامەکاندا دەگێڕدران و لە پێشیانەوە خاچەکان و پیاوانی ئاینی بە جلە تایبەتی‌یەکانی خۆیانەوە دەڕۆیشتن، لە سەردەمی (هشام بن عبدالملك)دا کاتێك کە بەترياركی نوێ چوو بۆ ئیسکەندەریەی میسر بە ئاهەنگێکی گەورە پێشوازی لێکرا کە لە پێشیانەوە مۆم و خاچەکان و ئینجیلەکان دەگێڕدران، کەواتە سنگفراوانی و لێبوردەیی ئایینی لە شارستانێتی ئێمەدا وێنەی نەبووە بە درێژایی مێژوو، کە مێژوونووسە بیانی‌یە بەوویژدانەکانیش لەسەر ئەم لێبوردەیی‌یە هاوڕان.

مستەر (درابەر)ی مێژوونووسی بەناوبانگی ئەمریکی دەڵێت: {موسوڵمانە یەکەمەکان لە سەردەمی خەلیفەکاندا لەگەڵ گاورە نەستوری‌یەکان و جوولەکەکاندا تەنها بەڕێزەوە مامەڵەیان نەدەکرد، بەڵکو زۆرێك لە کارە گرنگەکانی دەوڵەتیشیان پێسپاردن و پلەیان بەرزکردنەوە، تەنانەت (هارون الرشید) هەموو قوتابخانەکانی خستە ژێر سەرپەرشتی (یوحنا بن ماسویه)، سەیری ئەو وولاتە نەدەکرا کە زاناکە تێیدا ژیاوە یان ئەو ئاینەی لەسەری لەدایکبووە، بەڵکو تەنها سەیری پلەوپایەی دەکرا لە زانست و مەعریفەدا}.

مێژوونووسی بەناوبانگ (وێڵز) لە باسەکەیدا دەربارەی تەعالیمە ئیسلامی‌یەکان دەڵێت: {ئەم ئاینە لە جیهاندا چەند خوو و باوێکی گەورەی دروستکرد لەسەر بنەمای هەڵس وکەوتی ڕێزدار و دادپەروەرانە، هەر ئەمەیە کە گیانی ڕێز و بەخشندەیی و لێبوردن دەکات بە بەری خەڵکدا، هەروەها خاسی‌یەتێکی مرۆڤدۆستانەی لەتواناداجێبەجێکراوی هەیە، کە کۆمەڵگایەکی دروستکرد زۆر کەمتر لەهەموو ئەو زەوی‌یەی کە زوڵم و ستەمی تێدابەرپابوو بوو نادادپەروەری تێدا دەکرا}، لەدوایی‌دا دەڵێت: {ئیسلام پڕە لە گیانی بەزەیی و لێبوردەیی و برایەتی}...

(رینو) دەربارەی مێژووی پەلامارەکانی موسوڵمانان بۆ فەرەنسا و سویسرا و ئیتاڵیا و دورگەکانی دەریای ناوەڕاست دەڵێت: {موسوڵمانان لە شارەکانی

ئەندەلوسدا بەشێوازێکی زۆر باش لەگەڵ گاورەکاندا هەڵس وکەوتیان دەکرد، لەبەرئەمە گاورەکان زۆر موراعاتی هەست و شعوری موسوڵمانانیان دەکرد و دەچوون منداڵەکانیان خەتەنە دەکرد و گۆشتی بەرازیان نەدەخوارد}.

بەم شێوەیە دەتوانین بە تەواوەتی وەڵامی ئەو ڕۆژئاواییی‌یە دەمارگیرانە بدەینەوە کە دەربارەی مێژووی ئێمە بوختان و هەڵبەستنیان کردووە، باشتر وابوو کە ئەم دەرگایەیان لەخۆیان نەکردایەتەوە چونکە تاوانە ئابڕووبەرەکانی ئەوان لەبارەی دەمارگیریی ئاینی‌یەوە دژی موسوڵمانانی ئیسپانیا و لە جەنگەکانی خاچپەرستاندا مایەی سەرشۆڕی و شەرمەزاری‌یە بۆیان، تەنانەت کارە نامرۆیی‌یەکانیان لە چەوسانەوەی نێو خۆشیاندا هیچ کەسێك کە شارەزایی مێژوویی هەبێت ئینکاری ناکات.

کەواتە تۆ لەگەڵ مندا نیت کە ووتەکەی (غوستاف لوبون): {هەموو میللەتەکان وەکو فاتیحە عەرەبەکان کەسی بە بەزەیی و لێبوردەی نەدیوە و هیچ ئاینێکی وەکو ئاینەکەی ئەوان لێبوردە و سنگفراوانی نەدیوە!} کەواتە پێش هەموو شتێك ئەمە ئینصافە بەرامبەر بە حەق و ڕاستی پێش ئەوەی کە ئینصاف بێت بەرامبەر بە موسوڵمانان.

## ڕەووشتە جەنگی‌یەکانمان:

ئەمەش لایەنێکی تری پرشنگداری مرۆیی‌یانەی شارستانێتی ئێمەیە، کە ناوازەیە لە شارستانی‌یەتماندا، ڕەووشتبەرزی و نەرم ونیانی و بەزەیی هاتنەوە بە لاواز و بێدەسەڵاتدا و سنگفراوانی لەگەڵ هاوسێ و ناسیاواندا کارێکە لەوانەیە زوربەی میللەتان لەکاتی ئاشتی‌دا ئەنجامی بدەن ئەگەر زۆر دڕندەش بن، بەڵام هەڵس وکەوتی جوان لەکاتی جەنگدا و نەرم ونیانی لەگەڵ دوژمناندا و بەزەیی هاتنەوە بە ئافرەتان و منداڵان و پیروپەککەوتەکاندا و لێبوردەیی بەرامبەر بە ژێرکەوتووان، هەموو نەتەوەیەك ناتوانێت بیکات و سیفەتی زۆرێك لە سەرکردەکان نەبووە، بینینی خوێن خوێن هەڵدەچێنێت و دوژمنایەتی ئاگری حیقد و تووڕەیی هەڵدەگیرسێنێت، و خۆشی سەرکەوتن فاتیحەکان سەرخۆشدەکات و بەهۆیەوە دەکەونە شەرمەزارترین جۆرەکانی تۆڵە سەندنەوە و

دڵخۆشکردن بەدوژمنان، ئەمە بریتی بووە لە مێژووی دەوڵەتانی کۆن و نوێ و دەتوانین بڵێین مێژووی مرۆڤایەتیشە هەر لەو کاتەوەی کە (قابیل) خوێنی (هابیل)ی برای ڕشت.

بەڵام مێژوو تاجەگوڵینەی نەمریی دەخاتە سەری رابەرانی مەدەنی و سەربازی شارستانێتی ئێمە، بە فاتیح و فەرمانڕەواکانەوە، چونکە لەناو هەموو شارستانی‌یەتەکاندا تاك بوون بە مرۆڤایەتی‌یەکی دادپەروەرانە لە گەرمەی شەڕە هەڵگیرساوەکانیشدا و لەو کاتانەشدا کە بارودۆخ هانی تۆڵە سەندنەوە و خوێنڕشتن دەدات، سوێند بەخوا ئەگەر مێژوو بە دووروودرێژی باسی ئەم موعجیزە ناوازەیەی نەکردایە لە مێژووی رەووشتە جەنگی‌یەکاندا بەشێوەیەك کە گومانی تێدا نەهێشتووە، ئەوا دەمووت ئەمە ئەفسانەیەکە لە ئەفسانەکان! و ئوستوورەیەکە کە سێبەری نی‌یە لەسەر زەوی‌دا!.

شارستانێتی ئێمە لەکاتێکدا هات کە هەموو جیهان لەسەر یاسای دارستان دەڕۆیشتن، بەهێز لاوازی دەکوشت و چەکدار بێچەکی کۆیلە دەکرد، و جەنگ یاسایەکی دانپێدانراو بوو لەنێوان هەموو یاساکان و ئاینەکان و نەتەوەکاندا، بەبێ سنوور و کۆتدانان و بەبێ جیاوازی لەنێوان جەنگێکی رێپێدراو یان ستەمکارانە، هەر کەسێك بیتوانیایە کە نەتەوەیەك ژێردەست بکات لە زەوی‌یەکەی‌دا و بەزۆر بیروباوەڕەکەی بگۆڕێت یان پیاوان و ئافرەتانیان کۆیلەبکات دەیکرد بەشێوەیەکی ئاژەڵیی دڕندانە، بەڵام ئیسلام هات و رایگەیاند کە ئەصڵ و بنچینە لە پەیوەندی نێوان نەتەوەکان و میللەتەکاندا یەکترناسین و هاوکاری‌یە ﴿یا أیها الناس إنا خلقناكم من ذكرٍ وأنثى وجعلناكم شعوبا وقبائلَ لتعارفوا إن أكرمكم عند الله أتقاكم﴾ (الحجرات:١٣) واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێر و مێ‌یەك دروستکردووە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە)، و کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە، بێگومان بەڕێزترینتان لەلای خودا تەنها ئەوانەتانن کە پارێزکار ترینتانن، بەهۆی ئەمەوە لە ئیسلامدا ئاشتی بریتی‌یە لە پەیوەندی ئاسایی نێوان میللەتان ﴿یا أیها الذين آمنوا ادخلوا في السلم كآفةً﴾

(البقرة:٢٠٨)، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە هەر هەمووتان خۆتان بخەنە ژێر سایەی ئیسلامەوە (کە هەمووی ئاشیخوازییە).

ئەگەر هەر میللەتێکیش هەر جەنگ و دەستدرێژی بوێت بەرامبەر بە میللەتانی تر ئەوا ئەو کاتە جەنگی لەگەڵ دەکرێت: ﴿وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ولا تعتدوا إن الله لا يحب المعتدين﴾ (البقرة: ١٩٠) واتە: بجەنگن لەپێناوی ڕێبازی خوادا دژی ئەوانەی کە دژتان دەجەنگن، نەکەن دەستدرێژی بکەن (دژی ژن و منداڵ و ماڵات و ... هتد) چونکە بەڕاستی خودا ئەو دەست درێژکەرانەی خۆش ناوێت، هەرکاتێکیش کە وازیان لەو نیازە خراپانەیان هێنا و ئاشتییان وویست ئەوا دەبێت ئەوانی تریش ئاشتی بەرپابکەن و بیپارێزن: ﴿وإن جنحوا للسلم فاجنح لها وتوكلْ على الله إنه هو السميع العليم﴾ (الأنفال:٦١) واتە: هەر کاتێك ئەوان (واتە بێباوەڕان) ملیاندا بۆ ئاشتی، تۆش (ئەی محمد ﷺ) بەهەمان شێوە ملبدە بۆ ئاشتی و پشت و پەنات تەنها خودابێت، چونکە خودا بیسەر و زانا و ئاگادارە، لێرەدا بنەماکانی شارستانییەتمان شەڕکردن بە مەبەستی داگیرکردن و تاڵانی و ژێردەستە کردنی میللەتان قەدەغە دەکات و جەنگی ڕێپێدراو تەنها بۆ دوو مەبەستە:

١ – بەرگری کردن لە عەقیدە و بیروباوەڕ و ڕەووشتی نەتەوەکەمان.

٢ – بەرگری کردن لە ئازادی میللەت و سەربەخۆیی و سەلامەتییەکەی ﴿وقاتلوهم حتى لا تكونَ فتنةٌ ويكونَ الدين لله﴾ (البقرة:١٩٣) واتە: ئێوە بجەنگن لەگەڵ بێباوەڕاندا، تاوەکو هاوەڵگەری و ئاشوب و ناخۆشی نەمێنێت، هەروەها تا دین و ئاین و بەرنامەی فەرمانڕەوایی هەر بۆ خوای گەورە بێت.

ئازادی بیروباوەڕ پێویست نییە تەنها بۆ ئەو نەتەوەیەی کە ڕاگەیاندنی جەنگ دەکات، بەڵکو پێویستە لەسەری کە ئازادی بیروباوەڕ بۆ هەموو بیروباوەڕەکانی تریش دەستەبەر بکات، و شوێنی پەرستنەکانی هەموو ئاینەکانی تریش بپارێزێت: ﴿ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لهدمت صوامع وبيع وصلوات ومساجد يذكر فيها اسم الله كثيرا﴾ (الحج:٤٠)، واتە: خۆ ئەگەر خوا خەڵکی نەدا بەیەکدا و حەق دژی بەتاڵ نەوەستێت، ئەوا هەرچی شوێنی خواپەرستی جوولەکە و گاور

هەیە لە خەڵوەتگا و کڵێسا و کەنیسە، هەروەها مزگەوتەکانیش کە ناوی خوای زۆر تێدا دەبرێت، هەمووی کاول دەکرێت، ناوازەترین شتێك کە شارستانێتی ئێمە بانگەشەی بۆ کردووە ئەوەیە کە بەرگری کردن لە ژێردەستان و لاوازانی نەتەوەکانی تر پێویستە لەسەرمان هەروەك چۆن بەرگری کردن لە ئازادی و کەرامەتی خۆشمان پێویستە ﴿وما لكم لا تقاتلونَ في سبيل اللهِ والمستضعفين من الرجال والنساء والولدان الذين يقولونَ ربنا أخرجنا من هذهِ القريةِ الظالمِ أهلُها واجعل لنا من لدنك وليا واجعل لنا من لدنك نصيرا﴾ (النساء:٧٥) واتە: (ئەی ئیمانداران) ئەوە چیتانە و بۆچی ناجەنگن لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا و ڕزگار کردنی لاوازکراو و چەوساوەکاندا، لەو پیاوان و ئافرەتان و منداڵانەی کە دەڵێن: پەروەردگار تۆ ڕزگارمان بکە لەم شارەی کە خەڵکەکەی ستەمکارن و لەلایەن خۆتەوە پشتیوان و یارمەتیدەرێکمان بۆ سازبکە.

ئەگەر ئەمانە مەبەستەکانی جەنگ بێت لە شارستانێتی ئێمەدا ئەوا ڕێگەی نەداوە کاتێك کە جەنگ رادەگەیەنێت ببێت بە ئامێرێك بۆ دروستکردنی شەڕ و ناڕەوایی، هەربۆیە یەکێك لە بنەماکانی شارستانێتی ئێمە لەشەڕدا ئەوەیە کە جەنگ نەکات تەنها لەگەڵ ئەوانەدا نەبێت کە جەنگی لەگەڵ دەکەن: ﴿الشهر الحرام بالشهر الحرامِ والحرمات قصاص فمن اعتدى عليكم فاعتدوا عليهِ بمثل ما اعتدى عليكم واتقوا الله واعلموا أن الله مع المتقين﴾ (البقرة:١٩٤) واتە: ڕێزی مانگی حەرام پەیوەستە بە ڕێزگرتنی ئەوان بۆ مانگی حەرام (واتە ئەگەر لەو مانگەدا دژتان جەنگان ئەوا ئێوە مافە بەرگریکردنتان هەیە)، و دەستدرێژی بۆ سەر هەر شتێکی حورمەتدار دەبێت تۆڵەی بسەندرێت بەبێ زیادڕەویی، جا ئەوەی کە دەستدرێژی دەکاتە سەرتان ئێوەش مافتان هەیە بەقەدەر دەست درێژیەکەی ئەو تۆڵەی خۆتان بکەنەوە، و لەخوا بترسن و چاك بزانن کە بەڕاستی خودا یار و یاوەری پارێزکارانە، ﴿وقاتلوا في سبيل اللهِ الذين يقاتلونكم ولا تعتدوا إن الله لا يحب المعتدين﴾ (البقرة:١٩٠) واتە: بجەنگن لەپێناوی ڕێبازی خوادا دژی ئەوانەی کە دژتان دەجەنگن، نەکەن دەستدرێژی بکەن (دژی ژن و منداڵ و ماڵات و ... هتد) چونکە بەڕاستی خودا ئەو دەست درێژکەرانەی خۆش ناوێت.

هەرکاتێکیش کە جەنگ بەرپابوو ئەوا نابێت بنەماکانی خۆمانمان لەبیربچێتەوە و ستەم و زوڵم و خراپەکاری بەرپا بکەین و کاولکاری بڵاوبکەینەوە ... نەخێر جەنگی مرۆیی پوخت دەبێت بۆ خودابێت و هۆکارەکانی دەبێت مرۆیی یانە بمێننەوە تەنانەت لەکاتی گەرمەی شەڕیشدا، هەرلێرەوە بوو کە ئەو ئامۆژگاری یە نەمرانە هاتن کە نموونەیان نەبووە لە مێژوودا: ﴿کەس ئەتك مەکەن، منداڵ مەکوژن، پیر وپەککەوتە مەکوژن، ئافرەت مەکوژن، دارخورما مەبڕنەوە و مەیانسوتێنن، داری بەردار مەبڕنەوە، بزن یان مانگا یان ووشتر تەنیا بۆ خواردنتان سەربڕن، ئێوە بەلای کۆمەڵێك خەڵکدا دەڕۆن کە لە خەڵوەتگا و پەرستگاکاندا خەڵوەتیان کردووە، لێیان تێکمەدەن و وازیان لێبێنن بۆ ئەو کارەی خۆیان بۆ تەرخان کردووە﴾ (بەشێك لە وەسێتنامەی خەلیفە ئەبوبەکری سدیق بۆ سوپای ئوسامەی کوڕی زەید).

ئەمە بریتی بووە لەو جەنگە مرۆڤانەیەی موسوڵمانان بەرپایان کرد کە مەبەستیان سەرخستنی دینەکەی خودا بوو نەك شەڕ و دەستدرێژی کردن، بنەماکانی جەنگی مرۆییانەی موسوڵمانان تەنها لە قاڵبی تیۆری دا نەمانەوە وەك لە زۆرێك لە رێبازەکانی تردا دەبینرێت، بەڵکو بە کردار لە مێژووی موسوڵمانانذا بە ئاشکرا رەنگی داوەتەوە، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) کە پێشەوا و بنیاتنەری ئەم شارستانی یەتەیە دەبینین هیچ پێغەمبەرێك یان ریفۆرمخوازێك بە درێژایی مێژوو هێندەی ئەم ئازار و ئەشکەنجە نەدراوە و راوەدوونان نەکراوە بە ئەندازەی ئەو ١٣ ساڵەی لە شاری مەککەدا بانگەوازی دەکرد، هەروەها ١٠ساڵی شاری مەدینەش خاڵی نەبوو لە فرت وفێڵ کردن بەرامبەریان و پلاندانان بۆ لەناوبردنی خۆی و هاوەڵانی، باشە دەپرسین دەبێت رەووشتی پێغەمبە (ﷺ) لە جەنگەکانی دا چۆن بووبێت پاش ئەمانە، بابڕوانینە هەندێك نموونە لەمبارەیەوە:

لە شەری (ئوحود)دا مامی پێغەمبەر (حەمزە) شەهیدکرا کە بەندەیەك بەناوی (وەحشی) شەهیدی کرد بە هانی (هیند)ی ژنی (ئەبوسوفیان) و کاتێکیش گیانی لەدەستدا هیند داوای لێکرد کە دڵی بۆ دەربهێنێت و ئەوەبوو گازی لێگرت و جوویی وەك زیادڕەوی یەك لە تۆڵە سەندنەوەکەی دا، پاشان هیندیش و وەحشیش

موسوڵمان بوون و پێغەمبەریش (ﷺ) داوای لێخۆشبوونی بۆ هیند کرد و ئیسلام بوونی وەحشی وەرگرت و پێی ووت: (ئەگەر دەتوانیت دوور لە ئێمە بژیت ئەوا بڕۆ دووربکەوەرەوە)، ئەمە کاری پێغەمبەر بوو (ﷺ) لەگەڵ ئەو کەسەی کە مامە خۆشەویستەکەی کوشت و لەگەڵ ئەو ئافرەتەش کە دڵی جوویی؟!

لە یەکێك لە جەنگەکانیشیدا کاتێك ئافرەتێکی کوژراوی دوژمنانی بینی تووڕە بوو و فەرمووی: ئایا من بەرگریم لێنەکردن لەوەی کە ئافرەت نەکوژن؟ ئەم ئافرەتە باوەڕم نی‌یە بۆ جەنگ هاتبێت، کاتێکیش کە چووە ناو شاری مەککەوە و فەتحی کرد بە سەرکردایەتی ۱۰۰۰۰ جەنگاوەر، قورەیش خۆیان بەدەستەوەدا و لەبەردەم پێیەکانیدا لای کەعبە وەستان و چاوەڕێی حوکمیان دەکرد بەرامبەر بە ۲۱ ساڵ دژایەتی کردنیان لەگەڵ پێغەمبەر و ئەزیەت دانیدا، تەنها ئەوەندەی فەرموو: ئەی کۆمەڵی قورەیش ئێوە چاوەڕێی چی دەکەن و من چیتان بەسەر دێنم؟ ئەوانیش ووتیان: تۆ برایەکی بەڕێز و کوڕی برایەکی بەڕێزمانی، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: من تەنها ئەوەتان پێدەڵێم کە پێشتر (یوسف)ی برام ووتی: ئێوە هیچ گلەییتان لەسەر نی‌یە و داواکارم خوداش لێتان ببورێت ﴿قَالَ لاَ تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ (یوسف:۹۲)، بڕۆن ئەوا ئێوە سەرفرازن و هەمووتانم ئازاد کرد.... ئەوە ئەی خەڵکینە محمدی مامۆستای چاکە و پێغەمبەر بووە نەك ئەو سەرکردە خوێنرێژەی کە بۆ دەسەڵات هەوڵ دەدات و خۆشی سەرکەوتن سەرخۆشی دەکات.

ژیاننامەی شوێنکەوتووانیشی لە جەنگەکان و فتوحاتەکانیاندا نموونەیەك بووە لەم نوورە و شوێنپێ هەڵگرانی ئەم ڕێبازە بوون و جێبەجێکاری ئەم بەرنامەیە بوون، کە لە ناڕەحەتترین کاتیشدا ئەعصابیان لەدەست نەداوە و ئەم بنەمایانەیان بیرنەچۆتەوە، کاتێك هەندێك لە دانیشتوانی لوبنان لەبەرامبەر کاربەدەستەکەیان (علی کوڕی عبدالله ی کوڕی عەبباس) ڕاپەڕین ئەوەبوو جەنگی کرد لەگەڵیان و بەسەریاندا زاڵبوو و بە باشی زانی کە کۆمەڵێکیان لە شوێنەکانی خۆیان ڕاگوێزێت بۆ شوێنی تر کە ئەمە کەمترین سزایەکە بەرامبەر بەو کارەیان،

لێرەدا ئیمامی (الأوزاعي) کە ئیمام و موجتەهیدی شام بووە بۆ ئەم کاربەدەستەی نووسی و ناڕەزایی بەرامبەر بە کارەکەی نواند، و ووتی: نابێت ئەوانەی کە بەشدار نەبوون وەك بەشداربووەکان مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت، کاربەدەستەکەش بەپەلە گێڕانی یەوە بۆ گوندەکانیان بە سەربەرزی یەوە.

کاتێکیش کە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) بوو بە خەلیفە وەفدێکی خەڵکی بێباوەڕی (سەمەرقەند) هاتن بۆ لای و پێیان راگەیاند کە سەرکردەی موسوڵمانان (قوتەیبە) موسوڵمانانی بە غەدر لە شارەکەیاندا نیشتەجێ کردووە، ئەوەبوو عومەر قازی یەکی دیاری کرد بۆ حوکمدان لەسەر ئەم مەسەلەیە و قازیش داوای لێکۆڵینەوەی بارودۆخەکە بڕیاری‌دا کە موسوڵمانان لەشارەکە بکرێنە دەرەوە و سەرکردەی موسوڵمانان دوای ئەمە ئینزاری خەڵکی شارەکە بکات و بەپێی بنەماکانی جەنگی موسوڵمانان مامەڵەیان لەگەڵ بکات، بۆ ئەوەی کە خەڵکی شارەکە خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن، کاتێك خەڵکی سەمەرقەند ئەم مامەڵە بێوێنەیەیان بینی لە مێژوودا کە دادپەروەری‌یان بەسەر سوپای خۆیاندا سەپاند، تێگەیشتن کە ئەمانە نەتەوەیەکی شەڕخوازنین و رازی بوون کە لە سایەی سوپای موسوڵماناندا بن و موسوڵمانانیش لەگەڵیاندا بژین.

کاتێکیش سوپا سەرکەوتووەکانمان شارەکانی دیمەشق و حیمص و شارەکانی تری سوریایان فەتح کرد، (خالید) خەڵکی حیمص و (ئەبوعوبەیدە)ش خەڵکی دیمەشقیان کۆکردەوە و پێیان ووتن کە ئێمە پارەیەکمان لەئێوە کۆکردبۆوە بۆ ئەوەی کە بەرگریتان لێبکەین بەڵام ئێستا ئێمە دەڕۆین و ناتوانین بتانپارێزین و ئەمانەش پارەکانتانە و بۆتان دەگێڕینەوە! خەڵکی ئەو شارانەش هەموو ووتیان: خودا سەرتانبخات و بۆمانتان بگێڕێتەوە سوێند بەخودا حوکم و دادپەروەری ئێوەی هەڵگری ئاینێکی تر لای ئێمە خۆشەویستترە لە زوڵم و ستەمی رۆمە هاوئاینەکانمان.

لە جەنگی تەتەرەکانیش لە وولاتی شامدا زۆر دیلی موسوڵمانان و گاور و جوولەکە کەوتە ژێردەستیان، لێرەدا شێخی ئیسلام (ئیبن تەیمیە) تەدەخولی کرد و داوای رزگارکردنی دیلەکانی لێکردن، سەرکردەی تەتەرەکانیش وەڵامی دایەوە

و بڕیاری‌دا تەنها دیلە موسوڵمانەکانی بۆ ئازاد بکات، لێرەدا شێخی ئیسلام جارێکی تر تەدەخولی کرد و ووتی: دەبێت هەموو دیلە گاور و جوولەکەکانیش ئازاد بکەیت چونکە ئەوان هاوپەیمانی ئێمەن و هیچیان وازلێناهێنین!!.

ئەمە رەووشتی جەنگیی موسوڵمانان بوو، دەئێستا بابزانین رەووشتی جەنگی دوژمنان و رکەبەرەکانیان بەرامبەریان چۆن بووە؟ کاتێك کە خاچپەرستەکانی هەڵمەتی دووەم گەیشتنە شاری (معرة النعمان) لە شام ئابلۆقەیاندا تا ئەو کاتەی خەڵکەکەی خۆیان دابەدەستەوە پاش ئەوەی لە سەرانی خاچپەرستان بەڵێنی توندیان وەرگرت بۆ پاراستنی سەر و ماڵ و سامانیان، بەڵام کاتێك چوونە ناو شارەکەوە ئەوەندە تاوان و دڕندەییی‌یان ئەنجامدا کە سەری منداڵان سپی دەکات! مێژوونووسە بێگانە خاچپەرستەکان خۆیان ژمارەی کوژراوەکان لە پیاو و ژن و منداڵ و پیریان بە ١٠٠ هەزار مەزەندە کردووە!

دوایی بەردەوام بوون لە رۆیشتنیان تا گەیشتنە شاری (قودس) و ئابلۆقەیاندا، خەڵکی شارەکەش زانی‌یان کە ناتوانن بەرگەیان بگرن ئەوەبوو داوایان لە سەرکردەی هەڵمەتەکە (تانکرد) کرد کە ئەمانیان پێبدات بۆ خۆیان و سامانیان، ئەویش ئالا تایبەتی‌یەکی خۆی دانێ بۆ ئەوەی لەسەر مزگەوتی (الأقصى) هەڵیدەن و پەنای پێبدەن، ئیتر ئەوەبوو خاچپەرستەکان چوونە ناو شارەکەوە، بەڵام بڕوانە ئەو دڵڕەقی و تاوانە ئابڕووبەرانانەی کە ئەنجامیاندا، کاتێك دانیشتوانی (قودس) پەنایانبرد بۆ مزگەوتی (الأقصى) کە ئالای ئەمینی بەسەرەوە بەرز کرابووەوە و مزگەوتەکە پڕبوو لێیان، ئەوەبوو سوارە خاچپەرستەکان وەك مەڕ وماڵات سەریانبڕین و خوێن لە مزگەوتەکەدا هەڵسا و تا ئەژنۆی سوارەکان گەیشت !!!

شارەکە پاککرایەوە بە سەربڕینی هەموو دانیشتوانەکەی بە تەواوی بەشێوەیەك کە شەقامەکان گیرابوو بەهۆی سەرە بڕاوەکان و قاچ و دەستە پەڕیوەکان و لاشە شێوێنراوەکان، مێژوونووسەکان دەڵێن تەنها ئەوانەی کە لەناو مزگەوتەکەدا سەربڕان ژمارەیان گەیشتە ٧٠ هەزار! کە لەناویاندا ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە زانایان و خواپەرستان و ژنان و منداڵانیان تێدابوو، مێژوونووسە

خاچپەرستەکانیش ئیذکاری ئەم قەسابخانەیە ناکەن بەڵکو هەندێکیان بە شانازیشەوە باسی دەکەن!.

دوای ٩٠ ساڵ لەم قەسابخانە و کارەساتە گەورەیە (صلاح الدینی ئەیوبی) موسوڵمان شاری قودسی رزگار کردەوە، بابزانین ئەم چی ئەنجامدا؟

لە شارەکەدا زیاد لە ١٠٠٠٠٠ رۆژئاوایی تێدابوو کە ئەمانیدا بە هەموویان بۆ ماڵ و سامانیان و رێگەی دان کە لە شارەکە بچنە دەرەوە بەرامبەر بە بڕێکی کەم لە پارە کە ئەوانەی توانایان هەبوون بیدەن، و مۆڵەتی ٤٠ رۆژی دانێ بۆ ئەوەی دەرچن، ئەوەبوو ٨٤٠٠٠ کەسیان رۆیشتن و چوونە لای براکانیان لە شاری عەککا و شارەکانی تر، پاشان زۆرێك لە هەژارەکانیش بەبێ فیدیە ئازاد کران و (العادل)ی برای (صلاح الدین)یش فیدیەی ٢٠٠٠ کەسیدا، و مامەڵەی لەگەڵ ئافرەتانیشدا بەهاشێوەی پێشکەوتووترین پاشای سەرکەوتووی سەردەم بوو، کاتێکیش کە بەتریارکی خاچپەرستەکان وویستی دەرچێت رێگەیدا و لەگەڵ خۆیدا پارەیەکی بێشوماری پەرستگاکان و (الأقصى) و کڵێسای (القيامة)ی پێبوو، هەندێك لە دەست وپێوەندی (صلاح الدين) پێشنیاری ئەوەیان کرد کە ئەو پارانەی لێبسەندرێت، سوڵتانیش وەڵامی دایەوە: سوێند بەخودا هەرگیز غەدری لێناکەم، و تەنها ئەو بڕە پارەیەیان لێوەرگرت کە لە هەموو کەسێکی ئاسایی وەردەگیرا، ئەوەی کە ئەم کارە مرۆییەی صلاح الدين ئەنجامیدا لە قودسدا بەرزتر دەکات ئەوەیە کە لەگەڵ جەماوەری خاچپەرستەکاندا کە لە قودسەوە دەرچوون پاسەوانی نارد بۆ ئەوەی کە بیانپارێزن و بیانگەیەننە شوێنەکانیان لە صور و صەیدا بەوپەڕی ئەمانەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا لە جەنگدا بووە لەگەڵیاندا.

چیرۆکی صلاح الدين لەگەڵ رۆژئاواییەکان لە جەنگەکانی خاچپەرستاندا لە ئەفسانە دەچێت، و ئەگەر رۆژئاواییەکان خۆیان کە هیچ کاتێك رەزامەندی و سەرسوڕمانیان لە کارەکانی ئەم پاڵەوانە نەمرە و کارەکانی کۆتایی نایەت، ئەگەر ئەمان خۆیان ئاوا باسیان نەکردایە ئەوا لە رۆژگاری ئەمڕۆدا تاوانبار دەکراین بە زیادڕەوی و لایەنگری، رۆژئاواییەکان خۆیان باسی ئەوە دەکەن کە کاتێك پێی

گەیشت پاشای خاچپەرستەکان (ریتشاردی شێردڵ) نەخۆش کەوتووە، صلاح الدين پزیشکی تایبەتی خۆی نارده لای لەگەڵ میوه و دەرماندا کە ئەو سەرکرده صەلیبی یە دەستی نەدەکەوت، ئەمە لەکاتێکدا کە جەنگ لە گەرمەیدا بووه لە نێوانیاندا و سوپاکانیان بەرامبەر بەیەك دەجەنگان، هەر خۆیان باسی ئەوه دەکەن کە ئافرەتێکی رۆژئاوایی بە گریان و هاوارەوه خۆیدا بەسەر خێمەی سوڵتان (صلاح الدين)دا و سکاڵای ئەوەی بۆ دەکرد کە دوو سەربازی ئەو منداڵەکەیان فڕاندووه، ئەوەبوو صلاح الدين گریا و یەکێکی نارد بۆ ئەوەی بەدوای منداڵەکەدا بگەڕێت تا ئەو کاتەی کە دۆزییەوه و تەسلیمی کردەوه بەدایکی، و خۆی منداڵەکەی بە پاسەوانەوه نێردران بۆ شوێنی مەبەستیان... ئیتر پاش ئەم قسانەی ئەوان خەڵکی تر دەڵێت چی؟!.

کاتێکیش کە سوڵتان (محمد الفاتح) فەتحی (قوستەنتینیە)ی کرد، چووه ناو کڵێسای (ئایا صۆفیا) کە پیاوانی کڵێساکان خۆیان تێیدا حەشار دابوو، ئەمیش زۆر بەجوانی پێشوازی کردن و دووپاتی پاراستنی خۆی بۆیان کردووه، و داوای لە گاوره تۆقیوەکانی ناوی کرد کە بە ئەمانەوه بچنەوه بۆ ماڵەکانی خۆیان، پاشان کاروباری گاورەکانی رێکخست و مۆڵەتیدان هەر کەسە و شوێن کڵێسای خۆی بکەوێت و یاساکانی ئابووری و عادەت و تەقالید و کاره تایبەتییەکانی خۆیانی بۆ هێڵانەوه و مافیدا بە قەشەکان کە لەناو خۆیاندا بەتریرك هەڵبژێرن.

ئەوەبوو (جناديوس)یان هەڵبژارد و سوڵتانیش ئاهەنگێکی بۆ گێڕان کە هیچی لە ئاهەنگەکانی سەردەمی بیزەنتییەکان کەمتر نەبوو! و پێی ووت: تۆ بەترێرکی نوێ و هاوەڵی منی لە هەموو کاتێك و بارودۆخێکدا، و هەموو ئەو دەسەڵات و تایبەتییانەت دەبێت کە ئەوانەی پێش تۆ هەیانبووه، پاشان ئەسپێکی جوانی دایە بەدیاری و پاسەوانی تایبەتیشی بۆ دیاری کرد لە ئینکیشارییەکان (کە پاسەوانی تایبەتی سوڵتان بوون)، پاشانیش سوڵتان رایگەیاند کە دانیناوه بە یاساکانی کڵێسای ئەرتۆدۆکسیدا و لەژێر پارێزگاری ئەودایە، و هەموو ئەو گەنجینە و شوێنەواری قدیسەکان کە دزرابوون لە رۆژی فەتحدا لە کڵێساکان، لە بازاڕەکان کۆکرانەوه و درانەوه بە کڵێسا و پەرستگاکان.

لێرەدا نامانەوێت بەدرێژی باسی ڕەووشتی فاتیحە موسوڵمانەکان لە ئەندەلوس و بەچاکی هەڵس وکەوتیان لەگەڵ ژێردەستەکانیاندا بکەین و بەراوردی بکەین بەوەی کە ئیسپانیی‌یەکان ئەنجامیاندا کاتێك کە دەستیان گرت بەسەر (غەرناتە)دا (کە دواین شانشینی ئیسلامی بوو لە ئەندەلوسدا)، تەنها هەڵس وکەوتەکانی لایەنی دووەم دەخەینەروو: ئەوەبوو دوای ئەوەی کە شەست بەڵێن زیاتریاندا بە موسوڵمانان بەوەی کە ڕێز لە ئاینەکەیان و مزگەوتەکانیان و ماڵ و سامانیان بگرن، هیچ کامێك لەم پەیمانانەیان نەبردە سەر و دەستیانکرد بە قەتڵ وعام کردنیان و تالآنی کردنی ماڵەکانیان، تەنها ٣٢ ساڵ بەسەر کەوتنی غەرناتەدا تێپەڕیبوو کە پاپا فەرمانی دەرکرد لە ساڵی (١٥٢٤ز)دا کە هەموو مزگەوتەکانی ئیسپانیا بکرێن بە کڵێسا! ئیتر دوای ئەمە بە تەنها ٤ساڵ لە هەموو ئیسپانیادا یەك موسوڵمان و یەك مزگەوتی تێدا نەما، ئەمە بریتی بووە لە وەفای ئەوان بە بەڵێن و پەیمانەکانیان و ئەوەی پێشتریش وەفاداری ئێمەبووە.

لەکۆتاییدا دەڵێین: بۆ زۆر دوور بڕۆین ڕەووشتی جەنگی ڕۆژئاوایی‌یەکان بەرامبەر بە یەکتر بەئاشکرا لە دوو جەنگە جیهانی‌یەکەدا دەرکەوت و شوێنەواری دڵڕەقی‌یان ئاشکرابوو، هەروەها ڕەووشتی داگیرکرانەشیان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئیسلامی‌دا شایەتە لەسەر ڕاددەی ئەو بێبەزەیی و دڵڕەقی‌یەی کە هەیانە لەکاتی فەرمانڕەوایی و جەنگەکانیاندا، و ڕاددەی دوو ڕووییشان دەردەخات کاتێك کە لە کۆمەڵە نێودەوڵەتی‌یەکاندا مرۆیی و بەزەیی خۆیان باس دەکەن لەکاتێکدا کە لە جەنگەکانیان و موستەعمەراتەکانیان و ئەو وولآتانەی کە لەژێردەستیاندا بووە بە ئاشکرا دڕندەیی و وەحشیگەریی خۆیان دەرخستووە، ئەگەر یەکێکیش بیانووبێنێتەوە بۆ کارە ئابڕووبەرەکانی ڕۆژئاوایی‌یەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەوەی کە گەلێك بوون هێشتا شارستانێتی و مەدەنی‌یەت ڕەووشتی دانەدابوون، ئەی لەمڕۆدا بیانوویان چی‌یە؟ کە خۆیان بە ڕابەر و سەرمەشقی شارستانی‌یەت و مامۆستای دونیا لە زانستەکان و داهێنراوەکان و هونەرەکاندا دەزانن؟! ئەم مەسەلەیە بەڕای ئێمە بریتی‌یە لە خوویەکی خۆڕسك تیایاندا، نموونەی ئێمە و ئەوانیش وەك ووتەکانی ئەم شاعیرە وایە:

ملكنا فكان العفو منا سجية     فلما ملكتم سال بالدم أبطح

وما عجب هذا التفاوت بيننا     فكل إناء بالذي فيه ينضح

## بەزەیی هاتنەوە بە گیانداراندا:

بریتی یە لە بابەتێکی خۆش لە باسماندا دەربارەی شارستانێتی ئیسلامی، مرۆڤایەتی تا سەردەمی نوێش باوەڕیان وابوو کە ئاژەڵان بەشیان نی یە لە بەزەیی، و تا ئەمڕۆش زۆرێك لە میللەتان لەزەت دەبینن لە کوشتنی ئاژەڵاندا و بە وەرزشی دادەنێن، لێرەدا شارستانێتی ئێمە دەردەکەوێت بە بنەماکانی و واقیعەکەشی کە بەرگێکی بەزەیی پۆشیوە و خاوەنی هەستێکی مرۆیی یانەی نەرمە کە هیچ شارستانی یەتێکی تر نەیبووە لە کۆن و نوێشدا تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، بەزەیی یەك کە سەرنج ڕاکێشە و مایەی سەرسوڕمانە.

یەکەم شتێك کە شارستانێتی ئێمە رایدەگەیەنێت لەبواری بەزەیی هاتنەوە بە گیانداراندا ئەوەیە کە ئاشکرای دەکات کە جیهانی ئاژەڵان وەك جیهانی مرۆڤەکان خاسی یەت و تەبیعەت و رێکخستنی تایبەتی خۆیان هەیە: ﴿وما من دآبة في الأرض ولا طائر يطير بجناحيه إلا أمم أمثالكم ما فرطنا في الكتاب من شيء ثم إلى ربهم يحشرونَ﴾ (الأنعام: ٣٨) واتە: هیچ زیندەوەرێك و گیانلەبەرێك نی یە کە بەسەر زەوی دا بڕوات و هیچ باڵندەیەك نی یە کە بە باڵەکانی بفڕێت ئیللا ئەوانیش ئوممەت و گەلێکن وەك ئێوە، (دڵنیا بن) هیچ شتێك نی یە کە پشتگوێمان خستبێت لە کتێبە تایبەتی یەکەماندا (اللوح المحفوظ)، لەوەودوا هەر هەموو ئەمانە کۆدەکرێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان. کەواتە مافی بەزەیی یان هەیە وەك مرۆڤەکان، تەنانەت بەزەیی هاتنەوە بە ئاژەڵاندا خاوەنەکەی دەخاتە بەهەشتەوە:

﴿قال رسول الله (ﷺ): بينما رجلٌ يمشِى فَاشتد عليهِ العطَش ، فَنزلَ بِئْراً فَشرب مِنها ، ثُم خرج فَإِذَا هو بِكَلْبٍ يلْهثُ ، يأكُلُ الثرى مِن العطَش ، فَقَالَ لقَد بلَغَ هذَا مِثْلُ الذِى بلَغَ بِى فَملأَ خفه ثُم أمسكَه بِفِيهِ ، ثُم رقِى ، فَسقَى الكَلْب فَشكَر الله له ، فَغفَر له . قَالُوا يا رسولَ اللهِ ، وإن لنا فِى البهائِم أجراً قَالَ «فِى كُل كَبِدٍ رطْبةٍ أجر﴾ (رواه البخاري ومسلم ومالك وأحمد وأبوداود)، واتە: کاتێك پیاوێك بە ڕێیەکدا دەڕۆیشت زۆر تینوی

بوو چووه خوارەوه بۆ ناو بیرێك و لێی خواردەوه، كاتێك هاته دەرەوه سەگێكی بینی كه هەسكه هەسكی بوو و خۆڵی دەخوارد له تینوێتیدا، ووتی ئەم سەگه وەك منی لێهاتبوو له تینوێتیدا، ئەوەبوو قۆنەرەكەی پڕكرد له ئاو و به دەمی گرتی و سەركەوتەوه و ئاوەكەیدا به سەگەكە، خوای گەورەش سوپاسی كرد و له تاوانەكانی بووری، پاشا له پێغەمبەریان پرسی: ئایا ئێمه له ئاژەڵانیشدا چاكەمان دەست دەكەوێت، فەرمووی: چاكەكردن بەرامبەر هەموو گیاندارێك پاداشتی تێدایه.

هەروەها دڵڕەقی بەرامبەر ئاژەڵان مرۆڤ دەخاته ئاگرەوه: ﴿قَالَ رسولُ اللهِ (صلى ا عليه وسلم): « دخلتِ امرأةٌ النار مِن جراءِ هِرةٍ لها - أو هِر - ربطتها فلا هِى أطعمتها ولا هِى أرسلتها ترمم مِن خشاش الأرض حتى ماتت هزلاً »﴾ (رواه البخاري ومسلم) واته: ئافرەتێك بەهۆی بەچكه پشیلەیەكەوه چووه ئاگرەوه كه بەستبوویەوه، نەئەوەتا خواردنی دایه و نه بەرەڵلای كرد كه خۆی خواردنی خۆی پەیدا بكات تاوەكو لەبرساندا مرد، هەروەها حەرامه زۆر لەسەر وولاخ دابنیشین و دەفەرموێت: پشتی وولاخەكانتان مەكەن بەكورسی (رواه أحمد والحاكم)، هەروەها نابێت كاری لەتوانا بەدەری پێبكرێت، رۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) چووه باخی پیاوێكی ئەنسارەوه كه ووشترێكی تێدابوو، كاتێك پێغەمبەری بینی فرمێسك بەچاوەكانیدا هاته خوارەوه، پێغەمبەریش (ﷺ) چووه لای و فرمێسكەكانی سڕی و پرسیاری كرد: كێ خاوەنی ئەم ووشترەیە؟ خاوەنەكەی ووتی: من، ئەویش فەرمووی: بۆ لەخوا ناترسیت لەم ئاژەڵەدا كه خودا تۆی كردووه به خاوەنی؟! چونكه سكاڵای بۆ كردم كه زۆر هیلاكی دەكەیت و خواردنی باشی نادەیتێ (رواه أحمد وأبوداود).

هەروەها نەفرین كراوه لەوەی كه ئاژەڵان دەكاته نیشانەی چەكەكەی: ﴿لعن رسول ا من اتخذَ شيئاً فِيه روح غَرضا﴾ (رواه البخاری ومسلم)، و ئەوانەش كه داخیان دەكەن بۆ ئەوەی نیشانەبێت بۆ خاوەنەكەی، رۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) بەلای گوێدرێژێكدا رۆی كه له دەم وچاویدا نیشانه كرابوو و فەرمووی: لەعنەتی خوا لەو كەسه بێت كه نیشانەی كردووه، ئەگەر ئاژەڵەكەش لەوانه بێت كه

گۆشتەکەی دەخورێت چەقۆکە تەواو تیژبکرێت: ﴿قال رسول الله (ﷺ): إن الله كتب الإحسانَ على كُل شيءٍ فَإذَا قَتلْتم فَأحسِنوا الْقتلةَ وإذَا ذَبحتم فَأحسِنوا الـذبح وليحِد أحدكُم شفْرته فَلْيرح ذَبيحته﴾ (رواه مسلم) واتە: خوای گەورە فەرمانی کردووە کە هەموو شتێك بەچاکی ئەنجام بدرێت، ئەگەر ئاژەڵتان سەربڕی بەباشی سەریبڕن و چەقۆکەتان تیژ بکەن و دوایی پاڵی بخەن، هەروەها دەبێت ئەم تیژکردنە لەبەرچاوی خۆیشیدا نەبێت، پێغەمبەر (ﷺ) بەلای کەسێکدا رۆیشت کە ئاژەڵەکەی راخستبوو و لەبەردەمیدا چەقۆکەی تیژدەکرد، ئەویش پێی فەرمووو: دەتەوێت دوو جار بیکوژیت؟! باشە بۆ چەقۆکەت پێش ئەوەی کە رایبخەی تیژنەکرد؟! (رواه الطبراني والحاكم).

بڕوانە ئەم نموونە بەرزەش دەربارەی بەزەیی هاتنەوە بە گیاندارانددا لە شارستانێتی ئێمەدا، (عبدالله کوڕی مەسعود) دەڵێت: رۆژێك لە سەفەردا بووین لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوەبوو تەیرێکمان بینی لەگەڵ دوو بێچوویدا ئێمەش بێچووەکانمان لێبرد، تەیرەکە هات و بەدەورماندا باڵەفڕەی دەکرد، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هات و ئەمەی بینی فەرمووی: کێ دڵی ئەم دایکەی سوتاند بۆ بێچووەکانی؟ هەر ئێستا بێچووەکانی بۆ بگێڕنەوە (رواه أبوداود)، رۆژێکی تریش پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك شارە مێروولەیەکی بینی کە سوتێنرابوو، فەرمووی: کێ ئەمانەی سوتاند، ئەمە نابێت لەبەرئەوەی کە تەنها خودای ئاگر سزادەدات بەئاگر (رواه مسلم).

لەژێر رۆشنایی ئەم فەرمانانەدا شەریعەتی ئیسلام ئەوەندە یاسای بەزەیی و رەحمەت بە گیاندارانی داناوە کە مایەی سەرسوڕمانە و بەخەیاڵی کەسدا نەهاتووە، بڕیاریداوە کە بەخێوکردنی ئاژەڵەکە واجبە لەسەر خاوەنەکەی کە ئەگەر نەیکات دەبێت بەزۆر پێی بکرێت، یان بیفرۆشێت یان بەرەڵای کات بۆ شوێنێك کە بتوانێت لێی بژی.

ئەمە بنەماکانن کە لە واقیعدا رەنگیان دایەوە، کاتێك (عومەر) بەلای پیاوێکدا رۆی کە بزنەکەی رادەکێشا بۆ سەربڕین پێی ووت: تیاچوون بۆ تۆ بێت بۆ بەچوانی نایبەیت بۆ مردن؟! (عومەری کوڕی عبدالعزیز) لە نامەیەکیدا بۆ

کاربەدەستەکانی فەرمانی کرد کە کەس سواری ئەسپ نەبێت و هیلاکیان نەکەن مەگەر بۆ پێویستی‌یەکی گرنگ نەبێت، هەروەها نووسی بۆ بەرپرسی ڕێگاوبان کە کەس نابێت وولاخەکەی بە لغاوێکی قورس ببەستێتەوە و نابێت بنکەکەی ئاسن بێت، یەکێك لە کارەکانی موحتەسیبەکانیش (کە لێپرسینەوە و چاودێریی کارەکانی خەڵکی‌یان دەکرد) ئەوەبوو کە نەیاندەهێشت وولاخەکان زۆرتر لە توانای خۆیان لێباربکرێت، لە دەزگا خێرخوازی‌یەکانیشدا ئاژەڵان بێبەش نەبوون چونکە ماڵی وەقفی تایبەتی هەبووە بۆ چارەسەری نەخۆشی ئاژەڵان و هەروەها بۆ چاودێریی پیر وپەککەوتەکانیان!!.

ئەمە هەمووی بەڵگەیە لەسەر گیانی بەزەیی هاتنەوە لای نەتەوەی ئیسلامیی کە نموونەی نی‌یە لە هیچ نەتەوەیەکی تردا، ڕاستگۆترین نموونەش لەسەر ئەم گیانە لە شارستانی‌یەتماندا ئەوەیە کە هاوەڵێکی وەك (أبو الدرداء) دەبینین وولاخێکی دەبێت کە کاتێك لە گیانەڵەدا دەبێت پێ‌ی دەڵێت: ئەی وولاخەکەم لەلای پەروەردگار سکاڵام لێمەکە چونکە من هەرگیز لە توانای خۆت زیاترم لێبار نەکردوویت! هاوەڵێکی تریش (عدي بن حاتم) دەچوو نانی وورد دەکرد بۆ مێروولەکان و دەیووت ئەمانە دراوسێمانن و حەقیان بەسەرمانەوەیە، زانایەکی موسوڵمانیش (أبو إسحق الشيرازي) کاتێك بەڕێ‌دا دەڕۆی لەگەڵ پیاوێکی تردا سەگێکیان بینی، پیاوەکە بەسەگەکەی‌دا خوڕی، ئەم زانایەش پێیووت: وامەکە، ئەی نازانیت کە ئەم ڕێگەیە هاوبەشە لەنێوان ئێمە و ئەواندا!

بەرزیی ئەم دیاردەیە بەتەواوەتی هەست پێناکەین ئەگەر بێتو نەڕوانینە هەڵوێستی کەسانی تر بەرامبەر بە گیانداران لە کۆن و نوێ‌دا، ئەوەی یەکەم شت سەرنجمان ڕادەکێشێت ئەوەیە کە لای میللەتانی تر هیچ هاندەرێك نی‌یە بۆ بەزەیی هاتنەوە بە گیانداراندا و نەرمیی لەگەڵیان، بەڵکو دەبینین کە لای میللەتانی تر تا سەدەی نۆزدەیەمی زایینیش گیانداران دادگایی دەکران هەروەك مرۆڤ لەسەر کارەکانیان و حوکمی زیندانی و دەرکردن و مردنیان بەسەردا دەدرا هەروەك مرۆڤی تاوانبار!*.

---

* لەلایەکی ترەوە بڕوانە ئەم نموونانەی تر لە ڕۆژئاواوە کە ئاژەڵان وەك دەفری تاقیکردنەوەی چەکەکانیان بەکاردێنن: لە گۆڤاری (العربي)ی ژمارە (٣١٠)ی ساڵی (١٩٨٤)دا هاتووە:

## دەزگا خێرخوازی‌یەکان:

گەورەترین بەڵگە لەسەر پێشکەوتنی نەتەوەکان و شایەنی‌یان بۆ پێشەوایەتی کردنی جیهان بریتی‌یە لەو گیانە مرۆیی‌یە بەهێزەی لەناو ئەندامەکانی‌دایە، کە دەبێتە مایەی خێر و بەزەیی بۆ هەموو دانیشتوانی زەوی لە مرۆڤ و گیاندارانیش، بەم پێوەرەیە کە شارستانی‌یەتەکان نەمر دەبن و پێش ئەوانی تر دەدەنەوە.

نەتەوەی ئێمە گەیشتە لوتکە لەم بوارەدا کە هیچ میللەتێکی تر پێی نەگەیشتەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆشمان، لە سەردەمانی کۆندا چاکە لەلای میللەتانی تر تەنها لە سنووری پەرستگاکان و خوێندنگاکاندا بووە، لە سەردەمی نوێشدا میللەتانی رۆژئاوا گەیشتوونەتە لوتکە لە پڕکردنەوەی پێویستی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان لەرێی دەزگا گشتی و کۆمەڵایەتی‌یەکانیانەوە، بەڵام نەگەیشتوونەتە لوتکەی مرۆیی‌یانەی پوخت کە تەنها بۆ خودا بێت وەك نەتەوەی ئێمە پێیگەیشت لە سەردەمە جیاوازەکانی‌دا، گەڕان بەدوای ناوبانگ و ناسراوی و ناودەرکردن و نەمریی کاریگەریی سەرەکی هەیە لە هاندانی رۆژئاوایی‌یەکان بۆ کارە مرۆیی‌یەکان، بەڵام دەبینین پاڵنەری سەرەکی نەتەوەی ئێمە بۆ چاکەکردن تەنها رەزامەندی خودا بووە جا ئەگەر خەڵکی پێیان بزانی‌یا یە یان‌نا.

لەلایەکی ترەوە دەزگا خزمەتگوزاری‌یەکانی رۆژئاوا زوربەی جار تەنها تایبەتە بە نەوەکانی وولاتی خۆیان، بەڵام دەبینین دەزگا خێرخوازی‌یەکانی ئێمە باوەشی کراوە بووە بۆ هەموو مرۆڤێك بەڕەهایی بەبێ گوێدانە رەگەزی یان زمانی یان

---

وولاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا پـێش جـەنگی دووەمـی جیهـانی یەکـەم مەڵبەنـدیان دروسـتکرد بـۆ ئامادەکردنی ماددە ژەهراوی‌یەکانی چەکە کۆمەڵکوژەکان، وورده وورده پەرەیان پێسـەند دوای جەنگەکـە تاوەکو سێ مەڵبەندی گەورەی سەرەکی‌یان دروستکرد، زیاتر لە ٩٥٠ ملیۆن دۆلاریان تێچوو، کە دەیانتوانی ساڵی ٥٦٠ هەزار تەن ماددەی ژەهراوی بەرهەم بێنن، تا ساڵی ١٩٦٥ زیاتر لە ١٠٠ هەزار ئاژەڵیان بەکارهێنا وەك سووتەمەنی چەکە کیمیایی‌یەکان لەکاتی تاقیکردنەوەیاندا! هەروەها (بەریتانیا)ش هەستا بەهـەمان ئـەم تاقیکردنەوانـە بـەڵام ئـەم تـەنیا ٢ هـەزار گیانلەبـەر و زینـدەوەری لـەناوبرد لـە تاقیکردنەوەکانیانـدا! (روسیا)ش لە ئەنجامی هەمان ئەم تاقیکردنەوانەی‌دا زیاتر لە ٢٠ هەزار ئاژەڵی لەناوبرد!!!

وولاتی یان مەزهەبی، هەروەها جیاوازی‌یەکی تر ئەوەیە کە ئێمە دەزگای خزمەتگوزاریمان بۆ چەند مەبەستێکی تایبەتی دروستکرد لە هەندێك بواری هاوکاری کۆمەلایەتی‌دا کە تا ئەمڕۆش ڕۆژئاواییی‌یەکان شتی وایان دروست نەکردووە، و مایەی پێزانین و سەرسوڕمانن!! و بەڵگەشە لەسەر ئەوەی ئەو گیانە مرۆیی‌یەی شارستانێتی ئێمە فراوانتر و پاکتر و هەمەلایەنەتر بووە لە هەموو شارستانی‌یەتەکانی تر.

ئیسلام بە بەردەوامی هانی چاکە دەدات و داوا دەکات کە لە فەقیری نەترسین ﴿الشيطَانُ يعِدكُم الفَقْر ويأمركُم بِالفَحشاء واللَّه يعِدكُم مغفِرةً منه وفَضـلاً واللّـه واسِـع علِيم﴾ (البقرة: ٢٦٨) واتە: (کاتێك ئێوە لە ماڵ و دارایی‌تان دەبەخشن) شەیتان بەڵێنی هەژاری و نەداریتان پێدەدات (دەتانترسێنێت بە هەژاری)، و فەرمانتان پێدەکات بە گوناه و تاوان و خراپە و نەبەخشین، خوای گەورەش بەڵێنی لێخۆشبوونێکی تایبەتی خۆیتان پێدەدات، لەگەڵ زۆریی ڕۆزیی و بەهرەی فراواندا، خوداش فراوانگیر و زانایە.

ئەم چاکەکاری‌یەش گشتگیر دەکات بەسەر هەموو مرۆڤێکدا، پێغەمبەر (ﷺ) بۆی ڕوونکردووینەتەوە کە چاکە کردن تەنها بە پارە و سامان نی‌یە بەڵکو دەرگای زۆری تری هەیە وەك فەرمان کردن بە چاکە و بەرگری لەخراپە و لابردنی ناڕەحەتی لەڕێگای خەڵکی و ئاشتەوایی نێوان ناکۆکەکان و تەنانەت یارمەتی دان یەکتری لەبارکردنی کەلوپەلەکانیاندا، هەربۆیە دەبینین پێغەمبەر و هاوەڵەکانی دەسپێشخەر بوون لە چاکەکاری‌دا بەتایبەتی ئەو شتانەی کە خۆشەویستیش بووە لەلایان دەیانکرد بەخێر، هەر لێرەوە بۆچوونی (وەقف) لە شەریعەتی ئیسلامی‌دا پەیدابوو کە سەرچاوەیەکی بەپێزبوون بۆ دابینکردنی پارەی دەزگا کۆمەلایەتی‌یەکان.

دەزگا خێرخوازی‌یەکان دوو جۆر بوون یەکێکیان ئەوانەبوون کە لەلایەن دەوڵەتەوە دروستدەکران و وەقفی فراوانیان بۆ دیاری دەکرا بۆ پڕکردنەوە پێویستی‌یەکانیان، جۆری دووەمیش ئەوانەبوون کە لەلایەن ئەمیرەکان و سەرکردەکان و دەوڵەمەندانەوە دروستدەکران جا پیاو بوونایە یان ئافرەت، لێرەدا ناتوانین هەموو ئەو دەزگایانە بژمێرین بەڵکو ئاماژە بە هەندێکیان دەدەین:

یەکەم و گرنگترین دەزگا خزمەتگوزاری‌یەکان مزگەوتەکان بوون کە خەڵکی پێشبڕکێ یان دەکرد لە دروست کردنیاندا، کە لەناویاندا پەرستنەکان و هەموو چالاکی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانیش ئەنجام دەدران.

لەگرنگترین دەزگاکانی تر قوتابخانە و نەخۆشخانەکان بوون کە بە تایبەتی باسیان دەکەین، هەروەها دروستکردنی خان و دیوەخان و ئوتێل بۆ ڕێبواران و بێجێگایان و هەژاران، هەر لەم جۆرانە ئەو تەکێ و خانەقایانە بوون کە بۆ خەڵوەتگرتن بۆ پەرستنی خودا دروستدەکران، هەروەها خانووی تایبەت بۆ هەژاران دروستدەکران کە ئەو کەسانەی خانوو و لانەیان نەبووە دەچوونە ئەوێ، هەروەها (سیقایەکان) کە بریتی بوون لە هێنان و ئامادەکردنی ئاو بۆ سەر ڕێگا گشتی‌یەکان بۆ هەموو خەڵکی، هەروەها چێشتخانە میللی‌یەکان کە تێیاندا نان و گۆشت و شۆربا و شیرینی و خواردنی تریش دەبەخشرایەوە، هەروەها خانووی تایبەتی بۆ حاجی‌یەکان لە مەککە کە بەشێوەیەك بڵاوبوو بوونەوە کە هەموو زەوی مەککەی گرتبووەوە و هەندێك فەتوای ئەوەیاندا کە لەکاتی حەجدا حەرامە لە مەککە خانوو بەکرێ بدرێت چونکە زوربەی خانووەکانی وەقفە بۆ خێر، هەروەها هەڵکەندنی بیر لە دەشت و چۆڵەوانی‌یەکاندا بۆ ئاودانی مەڕومالات و ڕێبواران کە ژمارەیان ئێجگار زۆر بوو بە تایبەتی لەنێوان بەغدا و مەککە و دیمەشق و مەدینە و نێوانی زوربەی شارە گەورەکان، کە بەجۆرێك بوون ڕێبواران زۆر بەدەگمەن تووشی تینوێتی دەبوون.

هەروەها شوێنەکانی ریبات و پاسەوانی کردن لەرێی خوادا، کە موجاهیدەکان هەموو پێویستی‌یەکانیان لە چەك و خواردن و خواردنەوە لێیانەوە دەستدەکەوت و ئەم شوێنانە رۆڵی گەورەیان بینی لە بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی رۆم لە سەردەمی عەبباسی‌یەکاندا و هێرشەکانی خاچپەرستان بۆ سەر وولاتی شام و میسر، لەگەڵ ئەمانەشدا وەقفی تایبەتی بۆ ئەسپ و شمشێر و ڕم و ئامێرەکانی جیهاد هەبووە و ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کە کارگەی گەورەی دروستکردنی کەرەستەکانی جەنگ لە وولاتماندا بڵاوببێتەوە، و بەشێوەیەك ووردەکار بوون کە وای دەکرد خاچپەرستەکان لە ئێمە چەك بکڕن لەکاتی

